# ئیعجازی مرۆییێ
# له قورئان دا

ئاماده کردن:

محمد صدقی

# ئیعجازی مژوییێ لە قورئان



## ئیعجازی مژوییێ قورئان و گەلی سەبەء و لافاوی عەریم

*Nov. 12, 2016*



*ئیعجازی مژوییێ قورئان و گەلی سەبەء و لافاوی عەریم*

*خوای گەورە دەفەرموێت:*

*لَقَدْ كَانَ لِسَبَأٍ فِي مَسْكَنِهِمِ آيَةٌ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ كُلُوا مِن رِّزْقِ رَبِّكُم واشْكُرُوا لَهُ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ * فَأَعْرَضُوا فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ العَرِمِ وَبَدَّلْنَاهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَيْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَيءٍ مِن سِدْرٍ قَلِيلٍ) (سبأ 15-16*

*واتە(( سوێند بەخوا بەڕاستی بۆ خەڵکی سەبەء لە وڵاتی خۆیاندا بەڵگەو نیشانەی دەسەڵاتی خوا ئاشکرایە، کە ئەویش دووباخی زۆر گەورەبوو لە لای ڕاستو چەپی ناوچەکە. فەرمانیان پێدرابوو، کە بخۆن لە ڕزقو ڕۆزیی پەروەردگارتانو سوپاسگوزاری بن، وڵاتێکی خۆشو ئاوەدان، پەروەردگارێکی لێخۆشبووو لێبووردە... جا ئەوان لەباتی شوکرانەبژێرییو خواپەرستی پشتیانهەڵکردو بەدەم بانگەوازی خواوە نەچوون، بەهۆی ئەوەوە ئێمەش لافاوێکی وێرانکەرمان بەسەردا بەرەڵاکردن، کە باخو بێستانەکانی کاولکردن، ئەوسا لە جیاتی ئەو دوو باخە گەورەیە دوو باخی دڕکاویی بەروبووم تاڵو درەختی بێبەری وەك دارگەزۆو کەمێك درەختی (سدر)یش کە بەروبوومێکی کەمی هەیە، پێمانبەخشین))*

*کۆمەڵگەی سەبەء بەیەکێك لە چوار شارستانییە گەورەکە دادەنرێت، کە لە باشووری دورگەی عەرەبی ژیاون. بۆچوون وایە کە ئەم گەلە لە نێوان ساڵانی 1000- 750 پ.ز کۆمەڵگاکەی خۆیان دامەزراندووە.*

*شارستانیەتییەکەیان لە دەوروبەری ساڵانی 550 پ.ز ڕووخاوەو لەناوچووە، بەهۆی ئەو هێرشانەوە، کە دوو سەدە بەردەوامبوونو لە لایەن عەرەبو فارسەکانەوە ڕووبەڕوویان دەبووەوە.*

*کۆنترین سەچاوە کە باسی گەلی سەبەئی کردبێت تۆمارە جەنگییەکانی پاشای ئاشووری (سەرجۆنی دووەم)ە لە نێوان ساڵانی (722-705)پ.ز، لەو تۆمارانەدا پاشای ئاشووری ئاماژە بەئەو گەلانە دەکات، کە باجیان نە دەدا بە مەلیکی سەبەء (ئیت عمارا)، ئەمەش دێرینترین سەرچاوەیە، کە ئاماژە بۆ شارستانیەتی سەبەئی دەکات.*

*بەڵام ناتوانیت، تەنها بەپشتبەستن بە تاکە سەرچاوەیەك بڵێین ئەم شارستانییە لە ساڵانی 700ی پ. زدا دامەزراوە، لەبەر ئەوەی ئەگەری*

دامەزراندنی ئەم شارستانییەتە پێش ئەو مێژووە لەئارادایە. ئەمەش بەو واتایە دێت، کە مێژووی سەبەء پێش ئەو مێژووەیە، لە هەڵکۆڵراوەکانی (ئاراد نانار)دا، کە یەکێکە لە پاشاکانی شاری ئورە، وشەی (سابوم)هاتووە، کە مەبەست لێی شاری سەبەئە، ئەگەر وابێتو ئەم وشەیە واتای شاری سەبەء بێت، کەواتە میژووی ئەم گەلە دەگەڕێتەوە بۆ 2500ی پ.ز.

ئەو سەرچاوە مێژووییانەی باس لە گەلی سەبەء دەکەن دەڵێن:ئەم شارستانییە لە شارستانی فینیقی دەچوو، زۆربەی چالاکییەکانیان بازرگانی بوون، ئەم گەلە دەستیانگرتبوو بەسەر ئەو ڕێگا بازرگانییانەی بە باکوری دورگەکەدا تێپەڕدەبوون، بازرگانە سەبەئییەکان ئەگەر بیانوویستانە بازرگانییەکەیان بگەیەننە ناوچەکانی غەززەو دەریای ناوە ڕاست، دەبوایە مۆڵەت لە پاشای ئاشووری (سەرجۆنی دووەم ) وەربگرن، کە دەسەڵاتداری ناوچەی باکوری دوورگەکە بوو، یان باجبدەن لەرامبەر بازرگانییەکەیان.

کاتێك ئەم بازرگانانە دەستیان بە پێدانی باج کرد بە پاشای ئاشووری، ناویان لە تۆماری ساڵانەی ئەو ناوچەدا تۆمارکرا.

گەلی سەبەء بەپێی مێژووەکەیان بە گەلێکی خاوەن شارستانیی دادەنرێن، بەنداوی مەئرەب، کە یەکێك بووە لە نیشانەکانی شارستانیی ئەم گەلە، بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر ئەو ئاستە هونەرییە پێشکەوتووەی ئەم گەلە پێی گەشتوون، ئەمەش واتای ئەوە نییە، کە ئەم گەلە لەڕووی سەربازییەوە لاوازبوون، بەڵکو سوپای سەبەئی یەکێك بووە لەو هۆکارە گرنگانەی بوونەتە هۆی بەردەوامیی ئەم شارستانییە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ.

سوپای سەبەء یەکێك بووە لە بەهێزترین سوپاکانی ئەو سەردەمە، ئەم سوپایە بەرفراوانبوونێکی گەورەی بۆ دەسەڵاتدارانی سەبەء مسۆگەرکردبوو، سەبەئییەکان ناوچەی (القتبیین)یان گرتبوو، هەروەها توانییان دەست بەسەر زۆر ناوچەی قارەی ئەفریقادا بگرن، لەساڵی 24 پ.ز دا لە نێوەندی یەکێك لە هێرشەکانیاندا بۆ مەغریب، سوپای سەبەء سوپای (مارکوس ئیلوس غلوس)ی ڕۆمانیان تێکشکاند، کە حوکمی میصری وەك بەشێك لە ئیمبراتۆریەتی ڕۆمانی دەکرد، ئەم ئیمبراتۆریەتە، گەورەترین هێزی ئەو سەردەمەبوو، بێ ڕکابەر.

سەبەء بە سوپاکەیو شارستانییە پێشکەوتووەکەیەوە، یەکێك بوو لەهێزە گەورەکانی ئەو سەردەمە. لە قورئانی پیرۆزدا باسی ئەم سوپا بەهێزەی سەبەء هاتووە، کە بڕوا بەخۆبوونی ئەم سوپایە دەردەخات، لە ڕێی وتەی پێشەوایانی سوپای سەبەئەوە، لەگەڵ شاژنەکەیاندا ، وەك لە سورەتی (نمل) دا هاتووە:

(قَالُوا نَحْنُ أُولُو قُوَّةٍ وَأُولُو بَأْسٍ شَدِيدٍ وَالْأَمْرُ إِلَيْكِ فَانظُرِي مَاذَا تَأْمُرِينَ ) (النمل33).

واتە ((وتیان خۆت دەزانیت ئێمە خاوەنی هێزو تواناو دەسەڵاتی توندو تیژین، فەرمانیش فەرمانی تۆیە بیرکەرەوە، کە چ فەرمانێك دەدەیت))

مەئرەب پایتەختی سەبەء بوو، زۆر دەوڵەمەند بوو، ئەمەش بۆ پێگەجوگرافییەکەی دەگەڕێتەوە، کە زۆر لە ڕووباری ( الدهنا)وە نزیکبوو، کە خاڵی بەیەکگەشتن بوو لەگەڵ شاخی (بلق)، کە بۆ دروستکردنی بەنداو زۆر گونجاو بوو، سەبەئییەکان ئەم تایبەتمەندییەیان قۆستەوەو لەو ناوچەیدا بەنداوێکیان دروستکرد، هەروەها دەستیانکرد بە کاری ئاودێرییو کشتوکاڵ، بەمشێوەیەش گەشتنە ئاستێکی زۆر بەرزی گەشەکردن و مەئرەب بوو بە یەکێك لە ناوچە زۆر گەشەسەندووەکان.

نەخشە نووسراوەکان بە زمانی سەبەئی

بەنداوی مەئرەب بەرزاییەکەی گەشتە 16م و پانییەکەشی 60م و درێژییەکەی 620م، ئەمەش واتای ئەوەیە، کە ئەم بەنداوە دەتوانێت 9600 هیکتار زەوی ئاوبدات، ئەمەش 5300 هیکتار لە دەشتەکانی باشوورو ئەوەش کە دەمێنێتەوە لە دەشتەکانی باکوور.

لە هەڵکۆڵراوە سەبەئییەکاندا ئاماژە بەم دوو دەشتە کراوە بە ( مەئرەب و دوو دەشتەکە)، لە قورئانی پیرۆزیشدا بە گوزراشتێکی ورد ئاماژەیان بۆکراوە: (جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ)، کە ئاماژەیە بۆ بوونیرەزو باخ لەم دوو دەشتەدا. ئەم ناوچەیە بووە یەکێك لە دەوڵەمەندترینو بەهەمەدارترن ناوچەکانی یەمەن، ئەمەش بەهۆی ئەو بەنداوەو ئاوەکەیەوە بوو.

هەردوو لێکۆڵەر (ج- هوفلی فەرەنسیو غلاسری نەمساوی) ئەوەیان سەلماندووە، کە بەنداوی سەبەء بۆ سەردەمێکی دێرین دەگەڕێتەوە.

بەڵگە نووسراوەکان بە زمانی ( حمیر)ئەوە دەگێڕنەوە، کە ئەم بەنداوە ناوچەکەی گەیاندووەتە ئاستێکی بەرزی گەشەو بەخشین.

ئەم بەنداوە لە سەدەی پێنجەمو شەشەمی زاینیدا چاککرایەوە، بەڵام ئەم چاککارییە نەبووە ڕێگر لەبەردەم هەرسهێنانی ئەم بەنداوە لە ساڵی 543ی زاینیدا. ئەم بەنداوە بەهۆی (سَيل العَرِمِ)، کە قورئانی پیرۆز باسی کردووە، هەرەسی هێنا.

کە زەرەرو زیانێکی زۆری گەیاندو هەموو دارستانو ڕەزوباخەکانی بەرەو لەناوچوون برد، کە چەندین سەدە بوو سەبەئیییەکان بەخێویان دەکردن.

دوای داڕمانو هەرەسی بەنداوەکە سەبەئیییەکان تووشی وەستانو کپبوونێکی درێژخایەن بوون، کە ئیتر هەستانەوەیان نەبوو، ئەمەش کۆتایی ئەم گەلە بوو، کە بە هەرەسی بەنداوەکە دەستیپێکرد.

(سیل العرِم) کەبەسەر سەبەئدا هات:

ئەگەر لە ئایەتە قورئانییەکان ڕابمێنین، لەبەر ڕۆشنایی ئەو زانیارییە مێژووییانەی باسمانکردن، ئەوا هاوڕێکیو لەیەکچوونێکی گەورە دەبینین، هەموو لێکۆڵینەوە جیۆلۆجیو شوێنەوارییەکان ئەوەیان سەلماندووە، کە لە قورئاندا هاتووە، وەك ئەوەی قورئانی پیرۆز باسیکردووە ئەم گەلە شایەنی سزای خوایی بوون، کە گوێیان بۆ ئامۆژگارییەکانی پێغەمبەرەکانیان نەگرتو هەقیان بەدرۆ داناو باوەڕیان پێنەهێنا، سزاکەشیان (سیلِ عَرِم) بوو، کە قورئانی پیرۆز لە سورەتی سەبەئدا وەسفیدەکات: (لَقَدْ كَانَ لِسَبَأٍ فِي مَسْكَنِهِمْ آيَةٌ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ كُلُوا مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ واشْكُرُوا لَهُ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ * فَأَعْرَضُوا فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِم سَيْلَ العَرِمِ وَبَدَّلْنَاهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَيْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وشَيْءٍ مِّنْ سِدْرٍ قَلِيلٍ* ذَلِكَ جَزَيْنَاهُم بِمَا كَفَرُوا وَهَلْ نُجَازِي إِلَّا الكَفُورَ ) (سبأ: 15-17).

وەك ئایەتە پیرۆزەکە باسدەکات، سەبەء لە ناوچەیەکی بەناوبانگ لە جوانیدا دەژیان، پڕ لە باخوباخاتو ڕەز، هەروەها دەکەوتە سەر ڕێگای بازرگانی، لە ئاستێکی زۆر بەرزدابوون بە بەراود بە شارانی تری ئەو سەردەمە.

بارودۆخی ژیان لە شارێکی لەمجۆرەدا زۆر باش بوو، ئەم گەلە هیچ کۆششێکیان نەدەکرد، وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە دەفەرموێت، جگە لە: (كُلُوا مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَاشْكُرُوا لَهُ ) (بخۆن لە ڕزقو ڕۆزیی پەروەردگارتانو سوپاسگوزار بن) بەڵام ئەوەیان نەکرد، بەڵکو ئەوەی هەیانبوو بۆخۆیانیان دەگەڕاندەوە، وا گومانیان دەبرد، کە ئەمان خاوەنی ئەم وڵاتەن، ئەوایان خۆیان خۆشگوزەرانیو گەشەسەندیان بۆ بەدەستهێناوە، خۆبەزلزانینو لە خۆباییبوونیان هەڵبژارد لەبەرامبەر ملکەچبوونیان بۆ خوای گەورە، وەك ئایەتەکە دەفەرموێت: ((فَأَعْرَضُوا ...) (پشتیانهەڵکرد).

قورئانی پیرۆز ئەوەمان بۆ باسدەکات، کە سزای خوایی بۆیان بە ناردنی (سَيْلَ العَرِمِ) بوو، ئەم گوزارشتە قورئانییە، ئەوەمان بۆ دەردەخات، کە چون ئەم ڕووداوانە ڕوویاندا، وشەی (عَرِم) واتای ( بەربەست، یان بەنداوە)، گوزارشتی (سَيْلَ العَرِمِ) ئەو لافاوە وەسفدەکات، کە هات بۆ ڕووخاندنی ئەم بەنداوە.

وەك ئەوەی لە گوزارشتی (سیل العرم)دا بەکارهاتووە، وشەی (عریم) لە وشەی (عریمین) وەرگیراوە، کە ئەم وشەیە لە زاری دانیشتوانی ناوچەی باشووری ئەو دوورگەیەدا بەکارهاتووە، کە بەواتای(بەربەست، یان بەنداو) دێت. ئەم وشەیە لە بەدوادا گەڕانەکانی باشووری یەمەندا دۆزراوەتەوە، کە بەکارهێنانی زۆری هەیەو هەموویان ئەم واتایە دەگەیەنن. بۆ نموونە: ئەم وشەیە لەو نووسراوانەدا بەکارهاتووە، کە لەلایەن پاشای حەبەشی یەمەن(ئەبرەهە) دوای نۆژەنکردنەوەی بەنداوەکە لە ساڵانی542 و 543 ی زاینیدا تۆمارکراوە.

وَبَدَّلْنَاهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَيْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَيْءٍ مِّنْ سِدْرٍ قَلِيلٍ ) (سبأ: 16)، واتە ئەم شارە بە تەواوی نغرۆبووە، دوای داڕمانو) هەرەسی بەنداوەکە بەهۆی لافاوەکەوە، هەموو ئەو جۆگە ئاودێرییانەی سەبەئیییەکان هەڵیانکەندبوون لەناوچوونو ڕووخان، هەروەها ئەو دیوارەی، کە لە بیناکانیاندا وەك بەربەست لەنێوان شاخەکاندا دەردەکەوت، ئەو سیستەمە ئاودێرییە بەهیچ شێوەیەك بوونی نەما، ئەو باخانە بوونە جەنگەڵستان، هیچ جۆرە بەروبوومێك نەما.

خاوەنی کتێبی"الکتاب المقدس کان صحیحا"، دان بەوەدا Werner Keller نووسەرو زانای شوێنەوارناسی مەسیحی وورنر کیلر دەنێت، کە (سیل العرم)وەك ئەوەی لە قورئاندا هاتووە، ڕوویداوەو لەو ناوچەیەشدابووە، هەروەها لەناوچوونی ناوچەکە بەهۆی داڕمانو هەرەسی بەنداوەکەوە بووە، بەهەمان شێوە بەبەڵگەوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە ئەو نموونەیەی لە قورئانی پیرۆزدا لەسەر گەلی خاوەن دوو باخەکە هاتووە، بەتەواویو ڕاستی ڕوویداوە.

پاش ڕووداوی بەنداوەکە، زەویی ناوچەکە بەرەو بیابانبوون چوو، گەلی سەبەء لەگەڵ لەناوچوونی زەوییە کشتوکاڵییەکانیاندا گرنگترین سەرچاوەی بژێوییان لەدەستدا، ئەمەش سزای ئەو گەلە بوو، کە دژایەتی خوایان دەکردو لووتبەرزبوونو سوپاسگوزارییان نەکرد.

دوای ئەو کارەساتە ئەم گەلە لەبەریەکهەڵوەشان، دەستیانکرد بە کۆچکردن بۆ ناوچەکانی مەککەو سوریا.

شوێنەواری مەئرەبی چۆڵکراو، کە ڕۆژێك لە ڕۆژان نیشتمانی سەبەئیییەکان بوو، ئایەتێکە لە ئایەتەکانی سزای خوای گەورە، هەڕەشە لەوانە دەکات، کە هەمان هەڵەی ئەو گەلە دووبارەدەکەنەوە.

گەلی سەبەء تاکە گەل نەبوون، کە لافاو لەناویبردن، لە سورەتی (کەهف) دا قورئانی پیرۆز باسی خاوەنی دوو باخەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە، کە ئەم پیاوە دوو باخی بەبەرهەمی جوانی هەبوو، کە لە باخەکانی سەبەء دەچوون، ئەمیش هەمان هەڵەی ئەمانی کرد،

دژایەتی خوای گەورەی کردو یاخیبوو، وا گومانی دەبرد کە ئەم نیعمەتە لە خۆیەوەیەتی.

*وَاضْرِبْ لَهُم مَّثَلًا رَّجُلَيْنِ جَعَلْنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيْنِ مِنْ أَعْنَابٍ وحَفَفْنَاهُمَا بِنَخْلٍ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمَا زَرْعاً * كِلْتَا الْجَنَّتَيْنِ آتَتْ أُكُلَهَا وَلَم تَظْلِم مِّنْهُ
شَيْئاً وَفَجَّرْنَا خِلَالَهُمَا نَهَراً* وَكَانَ لَهُ ثَمَرٌ فَقَالَ لِصَاحِبِهِ وَهُوَ يُحَاوِرُهُ أَنَا أَكْثَرُ مِنكَ مَالًا وَأَعَزُّ نَفَراً * وَدَخَلَ جَنَّتَهُ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِ قَالَ مَا
أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَذِهِ أَبَداً * وَمَا أَظُنُّ السَّاعَةَ قَائِمَةً وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَى رَبِّي لَأَجِدَنَّ خَيْراً مِّنْهَا مُنقَلَباً * قَالَ لَهُ صَاحِبُهُ وَهُوَ يُحَاوِرُهُ أَكَفَرْتَ بِالَّذِي
خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّاكَ رَجُلًا * لَّكِنَّا هُوَ اللَّهُ رَبِّي وَلَا أُشْرِكُ بِرَبِّي أَحَداً * وَلَوْلَا إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَاءَ اللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ
إِن تَرَنِ أَنَا أَقَلَّ مِنكَ مَالًا وَوَلَداً* فَعَسَى رَبِّي أَن يُؤْتِيَنِ خَيْراً مِّن جَنَّتِكَ وَيُرْسِلَ عَلَيْهَا حُسْبَاناً مِّنَ السَّمَاءِ فَتُصْبِحَ صَعِيداً زَلَقاً * أَوْ يُصْبِحَ
مَاؤُهَا غَوْراً فَلَن تَسْتَطِيعَ لَهُ طَلَباً * وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِ فَأَصْبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيْهِ عَلَى مَا أَنفَقَ فِيهَا وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَى عُرُوشِهَا وَيَقُولُ يَا لَيْتَنِي لَمْ أُشْرِكْ
بِرَبِّي أَحَداً * وَلَم تَكُن لَّهُ فِئَةٌ يَنصُرُونَهُ مِن دُونِ اللَّهِ وَمَا كَانَ مُنتَصِراً * هُنَالِكَ الْوَلَايَةُ لِلَّهِ الْحَقِّ هُوَ خَيْرٌ ثَوَاباً وَخَيْرٌ عُقْباً ) (الکهف 32-44)*
.

وەك لەئایەتەکانەوە تێدەگەین، خاوەنی دوو باخەکە ئینکاری بوونی خوای نەدەکرد، بەڵکو ئەو لەو باوەڕەدابوو ئەگەر بشگەڕێتەوە بۆلای خوای گەورە، ئەوا باخێکی باشتر لەمانەی دەستدەکەوێت، کە ئەمەش بە ڕوونی هاوبەشدانانە بۆ خوای گەورە، هەر ئەمەش بوو کە گەلی سەبەء کردیان و سەرئەنجامیشیان نغرۆبوونی وڵاتەکەیان بوو، تا لەوە تێبگەن، ئەوان خاوەن دەسەڵات نین، بەڵکو ئەوەی هەیانە نیعمەتێکە لە خوای گەورەوە.

قورئانی پیرۆز ئەوەمان پێڕادەگەیەنێت، کە گەلی سەبەءو شاژنەکەیان، لەگەڵ خوادا خۆریان دەپەرست، پێش بڕواهێنانیان بە پێغەمبەر سولەیمان.

______________________________


*Reference;*

*. Hommel, Explorations in Bible Lands (Philadelphia: 1903), 739.*

*-*

*"Marib", Islam Ansiklopedisi: Islam Alemi, Tarihi, Cografya, Etnografya ve Bibliyografya Lugati (Encyclopedia of Islam: Dictionary of Islamic World, History, Geography, Ethnography, and Bibliography,) 7, 323-339.*

*-*

*Mevdudi, Tefhimül Kuran (An Honoring of the Qur'an) 4, Insan Yayinlari (Istanbul), 517.*

*-*

*Keller, Und die Bibel hat doch recht, 230*


______________________________


نوسین و ئامادە کردن؛

محمد صدقی یاسین

هەرێمی کوردستان-عراق

*Mohammed.sidqi@icloud.com*


---



## (ئیعجازی مێژوییی قورئان دوزینەوەی شاری (ئیرەم

*Nov. 12, 2016*

(ئیعجازی مژوییێ قورئان دوزینەوەی شاری (ئیرەم
و قورئان دەفەرموێت؛
[(أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ(6) إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ (7) الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلَادِ (8)]
ساڵی 1990 هەواڵی دۆزینەوەی (شارێکی عەرەبی ئەفسانەیی) ڕوپەڕی ڕۆژنامەجیهانیەکانی داگیر کرد و ئەو هەواڵە دونیای
(ڕۆژنامەگەری ئەوکاتەی هەژاند شاری (ئیرەم) ، (ئۆبار) ، (عبار) یان (دورگەی لمین.
بەڵام بەڵگە چییە ئەم شارەی کلاپ دۆزییەوە پێگەی ئەوگەلی (عـــاد)ە یە کە قورئانی پیرۆز باسی لێوە دەکات؟
دکتۆر زارینز یەکێك لە ئەندامەکانی ئەوتیمە توێژەرەو لێپرسراوی تیمی هەڵکەندنی ئەم شوێنەوارە بووە دەڵێت :پایەی زۆر گەورە یەکێکە لە نیشانە زۆر دیارەکانی شاری لەهەمانکاتدا شاری (ئیرەم) یش بە خاوەن کۆشکی پایە بەرز ناودەبرێت، جۆرە پایە و کۆڵەکەیەك کە نموونەی لە ناوچەکەدا نەبووە، ئەمەش باشترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم شارەی دۆزراوەتەوە ئەو شارەیە، کە قورئان باسی لێوە فەرمووە لە سورەتی (الفجر) داو دەفەرموێت:
[(أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ(6) إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ (7) الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلَادِ (8)]
واتە: [ئایا نەتزانیوە ئەی موحەمەد پەروەردگارت چی کردووە بە گەلی عاد
ئیرەم کە خاوەنی هێز تەلاری بەرز و کۆشکی پایە و کۆڵەکەی ناوازەبوون -6
لەسەردەمی ئەواندا لە هیچ شوێنێکدا کۆشك و تەلار و پایەی وەك ئەوەی ئەوان دروستنەکرابوو -7
سورة الفجر
یەکێکی تر لەو بەڵگانەی ،وامان لێدەکات بڵێین ئەم شارەی دۆزراوەتەوە شاری (ئیرەم) ە ئەوەیە، کە شارێکی بازنەییە و ڕاڕەوەکانی بە شێوەی بازنەییە و پایەی خڕ یان بازنەیی تێدایە، کە لەڕاستیدا ئەم جۆرە پایانە تایبەتن و هەموو شارە دێرینەکانی تری ناوچەکە بگەڕێیت تەنها پایەی چوارگۆشە دەبینیت و پایەی خڕ تەنها لەم شارەدا بەدیدەکرێت، هەروەها دەشڵێن پایەکانی ئەم شارە بە ئاڵتون ڕوکەشکراون، یان لە زیو دروستکراون، ئەمەش جوانییەکی کەموێنەی داوە بە پایەکان، ئەمەی باسکرا دەبێتە ڕاڤەیەکی واقیعی -فەرمودەکەی خوای گەورە کە دەفەرموێت [ الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلَادِ (8) ] –الفجر .
ئەمە وێنەی یەکێك لە قەڵاکانی شاری (ئیرەم) ە کە (10) م لەژێر چینەکانی لمی بیابانەوە بوو لەڕێگەی مانگی دەستکردی پێشکەوتوی ئەمەریکییەوە گیراوە، لەڕاستیدا ئەم قەڵایە بە گەورەیی و تایبەتمەندی پایەکانی جیادەکرێتەوە.
وێنەی شاری ئۆبار پێش هەڵکەندن کە ئاستەمە جیابکرێتەوە چونکە بەتەواوی لم دایپۆشیوە -1.
دەرکەوتنی شاری ئۆبار پاش هەڵکەندن و لابردنی 12 م لم -2 .
کە خوای گەورە لە بارەی توانای بیناسازی ئەم گەلەوە لەسەر زاری هود پێغەمبەرەوە -سەلامی خوای لەسەر بێت- پێیان دەفەرموێت؛
[أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ آيَةً تَعْبَثُونَ {128} وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ {129}وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ {130} فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ {131}وَاتَّقُوا الَّذِي أَمَدَّكُم بِمَا تَعْلَمُونَ {132} أَمَدَّكُم بِأَنْعَامٍ وَبَنِينَ {133}وَجَنَّاتٍ وَعُيُونٍ {134} إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ {135} قَالُوا سَوَاءٌ عَلَيْنَا أَوَعَظْتَ أَمْ لَمْ تَكُن مِّنَ الْوَاعِظِينَ {136}] –الشعراء-واتە: [ئایا ئێوە لە هەموو شوێنێکی بەرزدا بینای بڵند دروستناکەن؟ و گاڵتە بە خەڵکانی ڕێبواریش ناکەن؟ ئەمەش زیادەڕەوییەو هیچ سودێکی بۆ دین و دونیاتان نییە-128- لەڕێی کارگەکانتانەوە هەر خەریکی دروستکردنی قەڵا و باڵەخانەی بەرزن، یان خەریکی کۆگای ئاون لە ژێر زەویدا وادەزانن ئیتر نامرن-129 کاتێك دەست دەوەشێنن بە مەبەستی کوشتن یان لێدان زۆر بە ستەمکارانە ئەنجامی دەدەن-130- لەخوابترسن و گوێڕایەڵم بن ئەوە -9 باشترە بۆتان-131- لەخوابترسن لەو هەموو نازو نعمەتەی پێی بەخشیون و لێیشتان شاراوانییە-132- ئاژەڵی پێبەخشیون لە وشتر و مانگاو مالات... و منداڵ و نەوەیشی پێبەخشیون-133- هەروەها باخچە و باخات وبێستانی زۆر لەگەڵ کانی و ڕوبار و سەرچاوەی ئاو-134-
،تۆمارە مێژووییەکان دەریانخستووە، ئەم ناوچەیە سەوز و تەڕو پاراو و بەبەرهەم بووە، هەروەك لە قورئانی پیرۆزیشدا ئاماژەی پێکراوە
[١]

---

:Reference
سەرچاوەکان:
[١]:
-
Thomas H. Maugh II, "Ubar, Fabled Lost City, Found by LA Team," The Los Angeles Times, 5 February 1992.
226. Kamal Salibi, A History of Arabia (Caravan Books: 1980).
-
Bertram Thomas, Arabia Felix: Across the "Empty Quarter" of Arabia, (New York: Schrieber's Sons: 1932), 161.
-
Charlene Crabb, "Frankincense", Discover, January 1993.

---

نوسین و ئامادە کردن:
محمد صدقی یاسین
هەرئمی کوردستان-عراق
Mohammed.sidqi@icloud.com

---



Nov. 12, 2016

## ئیعجازی ڕزگار بوونی لاشەی فیرعەون بو بێتە پەند، بۆ هەموو پاشا و زۆردارەکانی سەر زەوی



ئیعجازی ڕزگار بوونی لاشەی فیرعەون بو بێتە پەند، بۆ هەموو پاشا و زۆردارەکانی سەر زەوی
زانایانی سەرسام کرد
وەك قورئان قورئان دەفەرمویت:
فَالْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ آيَةً ۚ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ عَنْ آيَاتِنَا لَغَافِلُونَ
ئەمڕۆ ئیتر لاشەی تۆ ڕزگار دەکەین تا ببێتە موعجیزە و پەند و ئامۆژگاری بۆ ئەوانەی دوایتۆ دێن ، بەڵام بەڕاستی زۆربەی خەڵکی لە ئایەت وموعجیزەکانی ئێمە غافڵن.
Holy Quran 10:92
[١]
دکتۆری فەڕەنسی (مۆریس بۆکای) ڕاستییەکی لەسەر لاشەی فیرعەون خستە ڕوو، دکتۆر وتی: بۆ یەکەم جار بۆمان دەرکەوت کە خاوەنی ئەم لاشەیە بە ڕۆچوون لە ئاودا خنکاوە و پەراسووەکانی بەیەکدا چوون و بە موعجیزەش لاشەکەی ڕزگاری بووە، لە دوای ئەوەش لاشەکە مۆمیاکراوە و تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان پارێزراوە.

بەڵام یەکێك لە موسڵمانەکان هەواڵی پێدا کە باسی ئەم ڕاستییە لە قورئاندا هاتووە، خوای گەورە دەفەرموێت:
فَالْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ آيَةً ۚ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ عَنْ آيَاتِنَا لَغَافِلُونَ
واتە: "ئەمڕۆ ئیتر لاشەی تۆ ڕزگار دەکەین تا ببێتە موعجیزە و پەند و ئامۆژگاری بۆ ئەوانەی دوای تۆ دێن، بەڵام بەڕاستی زۆربەی خەڵکی لە ئایەت و موعجیزەکانی ئێمە غافڵ و بێ ئاگان."
Holy Quran 10:92
دیارە خوای گەورە پاڕاستویەتی لەوەی کە ماسی بیخوات، شەپۆلی دەریا گەیاندیە کەنار، تا ئەوانەی کە بەخوایان دەزانی بەچاوی

خۆیان ببینن کە فیرعەون ئادەمیزادێکە وەک ئەو خەڵکە و ببێتە پەند، بۆ هەموو پاشا و زۆردارەکانی سەر زەوی کە ئەوە سەرئەنجامی مسۆگەری هەموویانە

بۆیە زانا فەڕەنسییەکە دەستی کرد بە لێکۆڵینەوە لەسەر ئیسلام و کاتێك بۆی دەرکەوت ئیسلام دینی ڕاستەقینەیە، وا بلاوو بووە کە بوە [موسلمان[٢

___________________

Referenc:
سەرچاوەکان؛
[١]؛
تەفسیری ئاسانی قورئان
[؛[٢
http://www.falaah.co.uk/basic-knowledge/quran-and-tafsir/184-the-dead-body-of-pharaoh
-
https://m.youtube.com/watch?v=1zs6z6E_Oik

___________________

محمد صدقی یاسین
هەرێمی کوردستان-عراق
Mohammed.sidqi@icloud.com

---

Nov. 12, 2016

## ڕاستی قورئان و دروستبونی بەردەکانی هەرەمەکانی میسر لە قوریکی (گڵ) سادەیە گەرم کراوە بە پلەیەکی گەرمی




وەك قورئان باس کراوە لیکۆلەرە فەرەنسیەکان و ئەمریکیەکان دوپاتیان کردۆتەوە کە ئەو بەردە زەبەلاحانەی لە دروست کردنی هەرەمەکانی میسر دا بە کار هاتووە تەنها قوریکی (گڵ) سادەیەو گەرم کراوە بە پلەیەکی گەرمی زۆر بەرز
: قورئان ئەفەرمویت
فَأَوْقِدْ لِي يَا هَامَانُ عَلَى الطِّينِ فَاجْعَل لِّي صَرْحًا لَّعَلِّي أَطَّلِعُ إِلَىٰ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُ مِنَ الْكَاذِبِينَ
فیرعەون سەرکەشانە وتی:، ئەی هامان تۆ لە قوریکی گڵ خشتی سوورەوە کراوم بۆ دروست بکە و قەڵایەکی بەرزو پتەوم بۆ بینا بکە باڵکو .پیایدا سەربکەوم تا خوای موسا ببینم هەرچەندە من بەڕاستی بڕوام وایە لە ڕیز درۆزنەکاندایە
Holy Quran 28:38
بو ماوەیەکی زورلیکۆلەران نەیانزانی ئەو بەردە زەبەلاحانەی و قورس کە لە دروست کردنی هەرەمەکانی میسر دا بە کار هاتووە ت چون ،بە سەریەکدا دانانەوە
هەر لەم سەر دەمەدا سەدەی بیستو یەکەم لیکۆلەرە فەرەنسیەکان و ئەمریکیەکان دوپاتیان کردۆتەوە کە ئەو بەردە زەبەلاحانەی لە دروست کردنی هەرەمەکانی میسر دا بە کار هاتووە تەنها قوریکی (گڵ) سادەیەو گەرم کراوە بە پلەیەکی گەرمی زۆر بەرز
: کاتێك قورئانی پیرۆز ١٤٠٠ پێش باسی دەکات وەک ئەفەرمویت،
فَأَوْقِدْ لِي يَا هَامَانُ عَلَى الطِّينِ فَاجْعَل لِّي صَرْحًا لَّعَلِّي أَطَّلِعُ إِلَىٰ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُ مِنَ الْكَاذِبِينَ
فیرعەون سەرکەشانە وتی:، ئەی هامان تۆ لە قوریکی گڵ خشتی سوورەوە کراوم بۆ دروست بکە و قەڵایەکی بەرزو پتەوم بۆ بینا بکە باڵکو !!...پیایدا سەربکەوم تا خوای موسا ببینم هەرچەندە من بەڕاستی بڕوام وایە لە ڕیز درۆزنەکاندایە
Holy Quran 28:38

*وه ئەم راستیە گەورە زاناکانی ئەم دوو ولاتە دوپاتی ئەکەنەوە و دوای سەیر کردنی پارچە لە بەردەکان لە ژیر ورد بینی زۆر گەورەدا بۆیان دەرکەوت کە ئەم بەردانە لە قوری (گڵ) سادەی گەرم کراو دروست کراون.هەروەك لە قورئانی پیرۆزدا باسکراوە*

*----------------------------*

*REFERENCE*
*1-*
*http://www.nsf.gov/discoveries/disc_images.jsp?cntn_id=109692&org=NSF*
*2-*
*https://www.sciencedaily.com/releases/2006/12/061209122918.htm*

*----------------------------*

*نوسەر:*
*محمد صدقی یاسین*
*ئیمەیل:*
*Mohammed.Sidqi@icloud.com*

Overview

# ئیعجازی مێژوویی
# لە قورئان

ئامادە کردن:
محمد صدقی یاسین